


**دەزگای توێژینەوە و بڵاوکردنەوەی موکریانی**

- **خولیای نووسین**
- نووسینی: رەزا بەراهەنی
- وەرگێڕانی: ئەمین گەردیگلانی
- نەخشەسازی ناوەوە: گۆران جەمال رواندزی
- پیتچنین: شاسەنەم
- بەرگ: ئاسۆ مامزادە
- ژمارەی سپاردن: ١٦١٨
- نرخ: ١٠٠٠
- چاپی یەکەم ٢٠٠٨
- تیراژ: ١٠٠٠
- چاپخانە: چاپخانەی خانی (دهۆك)

زنجیرەی کتێب (٢٩٠)





ماڵپەڕ: www.mukiryani.com

ئیمەیل: info@mukiryani.com






رەزا بەراهەنی

# ناوەرۆك


نووسراوی ئازاد ................................... ١

زمانی ئازاد .................................... ١٥

نووسراو و مەرگ ................................ ٢٧

فەرهەنگۆك....................................... ٣٩

## ١- نووسراوی ئازاد

تەنیا لە کاتی نووسیندا دەخولقێ، نە پێشتر و نە دواتر، تەنیا لە کاتی نووسیندا دەخولقێ. دەکرێ هەزاران ئەزموونت ببێ، دەکرێ هەزار گەڵاڵە دابڕێژی و تێکیدەی و سەرلەنوێ دایڕێژیتەوە، بەڵام دەبێ بزانی کە نووسراوە تەنیا لە کاتی نووسیندا دەخولقێ. نە پێشتر و نە دواتر. یانی لە کاتی نووسیندا ئەزموون تووشی گۆڕان دەبێ. گەڵاڵە لەبەریەك دەچێ، ئەو ڕەسەنایەتییەی کە بەر لە نووسین لە لات پیرۆز بوو، دزێو و بێڕەنگ و تەنانەت لەنێوچوو دێتە بەر چاوت. ژیانێکت هەیە و قەڵەمێك و هێندێ کاغەز، ژیان هەر ئەوەیە کە بە هۆی قەڵەمەوە لە سەر کاغەز وە گەڕ دەکەوێ. ئەوەی بەر لە نووسین ژیاوە و ئەوەی دوای نووسین دێتە ژیانەوە هیچ پێوەندییەکی بەو ژیانەوە نییە. پرژ و بڵاوە و ورێنەیەکی پووچە و وەکوو ڕاواندن وایە. تەنیا ئەو ژیانە، ژیانە. کە بە هۆی قەڵەمەوە دێتە سەر کاغەز. ئەگەر نووسین ئامانجێکی هەبێ، هەر لەو مەودایەی نێوان قەڵەم و کاغەزدایە. ئەگەر ئاواتێکی هەبێ، ئەگەر بیهەوێ گۆڕانکارییەك لە جیهاندا وەدی بێنێ، ئەگەر بیهەوێ سیستەمێکی لەبەریەك هەڵوەشێنێ و سیستەمێکی تر لە جێگای دانێ، هەر لە مەودای نێوان قەڵەم و کاغەزدا وەدیی دێنێ.





ناکرێ هیچ شتێکی قاڵبی و قەراردادی و دەرەکی و ئاسمانی و خودایی بە سەر نووسراوەکە دابسەپێنی. ژیانی نووسراوەیەك تەنیا بەستراوەتەوە بە ژیانی ئەو نووسراوەیەوە و پێوەندی بە هیچ هێزێکی دەرەکییەوە نییە. خۆی ئاسمانی خۆی دەستنیشان دەکا، خودای خۆی هەڵدەبژێرێ، زەویی خۆی ڕادەخا و مرۆڤەکانی دەخولقێنێ. خۆی کۆمەڵگاکەی پەروەردە دەکا. خۆی زمانەکەی هەڵدەبژێرێ، یانی نووسراوەیەکی ئازادە. لە ئازادی تەواودا نووسراوە و یان دەبێ بنووسرێ. دەنا ئەگەر وا نەبێ ناتوانین ناوی نووسراوەی لێبنێین. تەنیا قسەیەکی بێتام و بێمانایە، قسەیەکی پووچ و چرووکە، نووسراوە تەنانەت ئازادیی خۆشی، خۆی هەڵیدەبژێرێ. درۆ کردن بە پێچەوانەی مەسلەحەتی ئازادییە. چ ترسێکت لەو کوتە کاغەزە هەیە کە برێ درۆی بە سەردا دەسەپێنی و بە ناوی نووسراوەیەك پێشکەشی خۆتی دەکەی؟

کاغەز خوێنمژ و جەللاد نییە! کاغەز تەنیا دەروونی تۆی دەوێ. کاغەز دەیهەوێ کە چاڵاوەکانی ناخی تۆ کفارە بکەن، کاغەز دەیهەوێ دێوەزمەکانی ناخت ڕاچەنن، کاغەز دەیهەوێ کە حەیوان و فریشتە و ئینسان و خواکانی ناخی تۆ وە دەر کەون. نووسراوە سەرنجێکی ئازادانەیە بۆ پێچ و پلووچەکانی ناخ و ئەو پێچوپلووچانەش هەروا سادە و ساکار نین، تاکوو هاولفی بۆ دانێن: تاکوو نوسخەی بۆ بپێچنەوە، تاکوو فۆرمۆلێکی بۆ پەیدا بکەین.

تێکنیکی پیچەڵاوپووچی، پێچەڵاوپووچییە. ساکاری نییە. سادەپەسەندەکان خەڵکی ڕەشۆکی هەڵدەفریوێنن، ئەوانە درۆزنن، ئازاد نین و وریا و بەهۆشیش نین. پێچەڵاوپووچی وریاییی دەوێ. تێگەیشتن لە تەنزی تاڵ و شیرینی ژیانی دەوێ و ئەوە بزانە تەنیا ئەوانەی وریان، لە تەنزی پڕ لە پێچەڵاوپووچی ژیان دەگەن. بەڵام پێت وا نەبێ نووسین سەمایەکی ئازادانەیە، قەت! قەت!

نووسین گەڕانێکی قارەمانانەیە، بەش بە بەش و هەنگاو بە هەنگاو و موو بە موو بە شوێن گۆڕانێکدا وێڵە کە ڕۆحی مرۆڤ دەیدۆزێتەوە. ئەگەر غیرەتت نییە، دەست هەڵـگرە! ئەگەر ئەو هێز و گوڕ و پاڵەوانەتییە لە خۆتدا شك نابەی قەڵەمەکەت بشکێنە، چاوت بقووچێنە، چونکە وا دەردەکەوێ کە تەنیا ویستت ئەوەیە کە بچیتە ڕیزی شێوە شەهیدەکانەوە و لەو گۆڕەپانەشدا نەك شێوە شەهیدەکان، بەڵـکوو شەهیدانی بەڕاستیش پووڵێکی چرووك ناهێنن، چونکە نووسین دیتنی پێچەڵاوپووچی و لابردنی پێچەڵاوپووچی و شۆڕشی پێچەڵاوپووچی و پەسلانی ڕازاوەی پێچەڵاوپووچییە لە نێو زمانێکی پێچەڵاوپووچدا. پێت وا نەبێ کە شتێکی تایبەت بە خۆت نووسی خەڵـکی لەوانەیە بە شێوەیەکی دیکە لەمەڕ تۆوە ڕا دەربڕن و لەوانەشە ئیتر بە چاوی ڕێزەوە لێت نەڕوانن. خەڵـکی لەوانەیە لە شەرمانا سوور هەڵـگەڕێن، ئەوە گرنگ نییە. کە بیر و ڕای



قەراردادیی خەڵـك لە بارەی تۆوە چییە و چ دەبێ. تۆ هاتووی کە تەواوی گرێبەستەکان تێكبشکێنی. تەواوی یاسا و ڕێساکان لە نێوان هەڵـگری. تەواوی ڕەسەنایەتییەکان ڕووت کەیەوە و ئابڕوو چوونیان بنوێنی. دەبێ کاتی نووسین بە خۆت بڵێی سەر هەڵێنە ئەی دێوی دەروون با بزانم چ جینایەتێکیان لە نێو تۆدا بە بارمتە داناوە؟ سەر هەڵێنە فریشتەی دەروون با بزانم ئیتر بە چ خشڵێك ڕازاویەتەوە؟ سەر هەڵێنە ئەی دەروون با بزانم چ شتێکی دیکەت لە ناختدا حەشار داوە؟

ئازادانە و بێ قەیدوبەند، پاڵەوانانە بە ناخی خۆدا شۆڕ بوونەوە و گەڕان و هەڵسووڕان. تەنانەت ون بوون لە نێو زگپڕی و نەزۆکی و ڕەهەندە هەزار بە هەزارەکانی ژیانی خۆدا و سەرگەردان بوون. هەست بە تەنیایی کردن لە تەواوی ساتەکانی ژیاندا. لەگەڵ بیستنی هەر دەنگێك هەزار جۆر هیوادار و ناهومید بوون. لە ژێر هەر ئاسمانێکدا دیتنی بارستایەك هەور یان سەفایەك لە ڕەنگی خۆڵەمێش. خەوتن و ڕاچەنین و ناسینی تەواوی ڕێگاکان و نووسین. لێگەڕێ خەڵـکی پێت پێبکەنن کە لەخۆڕا هیواداری و لێگەڕێ خەڵـکی بۆت بگرین کە بێهۆ ناهومێد بووی. ئەوانە هیچ نین، گرنگ ئەوەیە کە تۆ هیوادار بووی و ناهومێد بووی. یانی تۆ ژیاوی. ئایا خەڵـکی بە هیوا و ناهومێدی تۆ ژیاون کە دەگرین و پێدەکەنن؟

هیچ شتێ بە غەیری مرۆڤـ، خودی مرۆڤـ و خودی نووسەر، ناوەندی هەموو نووسراوە گەورەکان نییە. ناوەند خودی نووسەرە. خەڵکیش؟ هەڵخە با هەڵخەین! هەڵدە با هەڵدەین! ئەوان بە دەوری نووسەردا هەڵدەسووڕێن.

کاغەز غایەن نییە. هیچ شتێ لە کاغەز مەشارەوە، ئەوەی بە زەینتدا ڕادەبرێ بیهێنە سەر کاغەز. ژیانی تۆ هەر ئەوەیە کە ئازادانە بە زەینتدا تێپەڕیوە" هیچ کەس غەیری خۆت مێژووی تایبەتی تۆ نییە و هیچ مێژوویەکیش غەیری مێژووی تایبەتی تۆ بوونی نییە. چونکە ئەو مێژووە مەزنە لە قووڵایی ناخ و ڕۆحی تۆوە سەری هەڵداوە. ئەگەر بە ناخی خۆتدا شۆڕ بیتەوە و تێی بڕوانی و بەیانی بکەی، جیهانیشت بەیان کردووە. خۆت ڕاگەیێنی، جیهانت ڕاگەیاندووە. کاتی نووسین خەیانەت دەکرێ بەو گەڵاڵانەی بەر لە نووسین داتڕشتوون. قوڕ بە سەر ئەو کەسەی کە نووسراوەکەی وەفادارە بە گەڵاڵەی بەر لە نووسین، هەر وەك ڕاهیبەیەك وایە کە بە مەسیح وەفادار مابێتەوە. ئەو چەشنە نووسراوانە شتێکی ساختەچییانەن. نووسراوە نابێ گرێبەستێکی لە دەرەوەی خۆی هەبێ، یان گرێبەستێك لە دەرەوەی خۆی قەبووڵ بکا. ئەوانەی کە کەسایەتییەکی قەراردادی لەمبەر دادەنێن و کەسایەتییەکی قەراردادی لەوبەر و شەڕێکی قەراردادی وە ڕێ



دەخەن و بە گومانی خۆیان هێزە خواییەکان دەبەن بۆ شەڕی هێزە شەیتانییەکان بە سواری ئەسپە دارینەی گەمژەیی.

کێ بەم شێوە قەراردادییە دنیای کردۆتە دوو بەش؟ هەموو شتێکی چاك لەو بارودۆخەدا خراپ و دزێو دەبێ و هەموو شتێکی خراپیش لە بارودۆخی جیاوازدا چاك و جوان دێتە بەر چاو. جووڵانەوە تەنیا لە بەشداریی دژکارەکان لەگەڵ یەکتر و تێکەڵ بوونی دژەکاندا دەخولقێ.

هیچ شەڕگەیەك، بە غەیری شەڕگەی دۆزینەوەی ئازادانەی ناخ، بوونی نییە. نووسەر دەبێ بڵێ: من دەبێ بە ڕەگ و ڕیشە بگەم، من دەبێ بزانم لەم خەڵوەتە سامناکەی ناخدا چ ڕادەبرێ؟ ئەو دەبێ کاتی نووسین ڕاوەستێ و لە خۆی بپرسێ، ئیتر چ شتێك لە خوێن و جینایەت و خراپە، یان بەپێچەوانە سەفا و پاکی و چاکە لە مندا هەیە؟ ئەو کەسانەی کە نووسەران بە دوو بەش دادەنێن و دەڵێن نووسەرانی ڕەشبین و گەشبین، زەبونترین و بەدڕەوشتترین خەڵکی ڕۆژگارن، دەبێ ئەو جۆرە کەسانە لە سەر ئاخوڕی ئەخلاق ببەستییەوە، تاکوو دەست بکەن بە کاوێژی چاکە و خراپە. جیهان ڕەنگاوڕەنگ و جۆراوجۆرە. ساتێکی تر من دەگۆڕدرێم و دەڵێم جیهانی دزێو، جوان، مەڵحەکە، پیس، یان بە شێوەیەکی دیکە. من کە بگۆڕدرێم دنیاش دەگۆڕدرێ. نووسەر جگە لەوە ناتوانێ ئەرکێکی دیکەی ببێ. لە ڕاستیدا ئەرکی

نووسەر خودی نووسراوەکەیەتی. نووسراوەش سەرتاپا ئازار و خەم و شادی و سەرخۆشی و ئاوات و ناکامییە و ئەم ژیانە دەتوانێ چ پەیامێکی پێ بێ، بێجگە لە خودی ژیان؟

هەر وشەیەك بەرەو لای وشەییێکی دیکەم ڕادەکێشێ. تەنیا ئەمە ڕێبەرە: زنجیرەیەك وەبیرهێنەرەوەی عادڵانەیە بۆ خولقاندنی گەڵاڵەیەك کە پێوەندی بە هیچ گەڵاڵەیەکی دیکەوە نییە. هەر وشەیەك کەرەسەیەك بۆ بەرین کردنەوەی ڕۆح و هەر بیرهێنەرەوەیەك ڕوانگەیەکی نوێیە، دڵەخورپەیەکی تازەیە تاکوو نووسراوە ببێتە داوەرییەکی عادڵانە بۆ نووسەر. لە ڕاستیدا عەدالەت چییە؟ عەدالەت یانی بێبەزییانەترین نێوبژیوانی بۆ نووسەرێك لە ڕێگەی نووسراوەکەیەوە. نووسەر تاوانبارێکە، پیاوکوژێکە، خودای خۆیەتی و کێ دەتوانێ لەمەڕ خوداوە چاکتر لە خودی خودا نێوبژیوانی بکا؟ عەدالەت یانی داماڵینی پێست، یانی چاو دەرپەڕاندن، یانی کەف هەڵخڕاندنی وتار، عەدالەت یانی ڕاسان بە دژی تەواوی ئەو شتانەی کە مرۆڤـ لە مرۆڤـ بوون و بە ڕووتی لە خۆ ڕوانین و بە ڕووتی لە دەریای خۆدا نوقم بوون دەگێڕێتەوە. نووسراوە دەبێ تاکوو بێبڕانەوە عادڵ بێ، یانی دەرهەق بە خودی نووسەریش بێبەزەیی بێ. ئەوکاتە هێندێ جووجەڵە لە پشت چاویلکەی کردەوەکانیانەوە دەڵێن فلانی پیس دەنووسێ! دەبێ نێوچاوانی ئەو کەسانە بە تەختە بەردا بکێشی



تاکوو بە سزای گەوجییەتی خۆیان بگەن. من ڕێزم هەیە بۆ پێچەڵاوپووچی، سڵاو بۆ پێچەڵاوپووچی! چونکە یەکدڵی و یەکڕەنگی لە پێچەڵاوپووچیدایە، یەکڕەنگی چییە؟ دەرکێشانی قسە لە زمانی کەسێکی سوێندخواردووە، کە نایهەوێ ددانی پیابنێ. نووسراوە، نووسەر بەرەو ئەو ددان پیانانە ڕێنوێنی دەکا. یەکدڵی ڕێگای ئەو سایلۆحانەیە کە خەیاڵ پلاو هەڵیگرتوون. ئەوانەی کە گەڵایەك بە دوو گەڵا دەبینن و پاشان دەست دەکەن بە گریان و لەم هەموو نێعمەتەی ئاوەدانی و یەکدڵی و یەکڕەنگی ناگەن. ئەوانە گەمژەن، یەکدڵی ڕاستەقینە کەسێکە کە گەڵا وەك خەنجەرێك لە سەر پەڕەی دڵی خۆی تاقی دەکاتەوە، ئەوەش مەسەلەیەکی ڕەمزاوییە. جۆرێکە کە دەبێ ساڵهای ساڵ بنووسم تا ئەو پێچەڵاوپووچییە بنوێنم. یەکڕەنگی شتێك غەیری دۆزینەوەی قووڵایی ناخ نییە و قووڵاییش هەر ساتەی گەورەترین ورە و پاڵەوانەتی بۆ ململانێ بانگ دەکا. کێ لەم هەزار بە هەزاری ڕۆحە، بە مەسخکراوی و عیبرەت وەرگرتوویی ناگەڕێتەوە؟ کێ چرچ و لۆچی دەم و چاوی لە پێچەڵاپووچییەکانی ناخ بە قەرز وەرناگرێ؟ کێ لەو سەفەرە، پیر و بە ئەزموون و عالم و زانا ناگەڕێتەوە؟ هەر لۆچێك، هەر تاڵە موویەك، هەر قەڵەشتێکی بەری دەست، نیشانەی شکەنجەیەکە کە نووسەر شانی وە بەر داوە. تاوانێکە کە کردوویەتی. زوڵم و ستەمێکە کە

ديتوويەتی. هەر شکەنجە و تاوان و زوڵمێکیش خۆی بیرهێنەرەوەی شادی و سەرخۆشی و ئاوات و ناکامییە. نووسەر چارەی نییە. غەیری ئەوەی چاو لەو ئیبلیسەی ناخی خۆی بکا و هەوڵ بدا بۆ ئاشکرا کردنی ڕازەکانی. تەنیا کەسێکیش دایمە یەکڕەنگە کە ساتێك لەو ئیبلیسەی ناخی خۆی غافڵ نەبووبێ. من چۆن شکەنجە کراوم؟ چۆن مردووم و زیندوو بوومەتەوە و هەمیسان مردوومەتەوە؟ چۆنم خەیانەت کردووە و چۆنم خەیانەت پێکراوە و چۆن ڕاوەستاوم و ڕوانیومە کە پیر و زانا و بە ئەزموون بووم؟ ئەوانە هەموو ئەو پرسیارانەن کە منی نووسەر لەو ئیبلیسەی ناخی خۆی دەکا. هیچ نووسەرێك هەقی نییە خۆی هەقدار نیشان بدا. ئەو دەبێ خۆی لەو کاتەدا کە بە لیتەی تاواندا ڕۆدەچێ، کاتێ خۆی لە داوێن پیسی وەردەدا، کاتێ کە بەرەو جەنایەت دەخوشێ، کاتێ کە هەم جەنایەت دەکا و هەم جەنایەتی دەرهەق دەکرێ، وەك ئاوێنە نیشانی بدا. نووسەر ویژدانی جەنایەتی زەمانە. ئەو کاتێ کە چەقوێ لە سەر ملی کەسێك داناوە یان کاتێ کە چەقۆیان لە سەر ملی ئەو داناوە دەبێ چۆك دابدا و ڕاستەقینە لە ڕوانگەی ناخەوە نیشان بدا. نووسین لە وەها کاتێکدا دوعای جەنایەتە. ئیتر وێنەیەك لە ژیان نییە، کردەوەی ژیانە. نووسین لەو کاتەدا تەرمێکە خەریکە دەڕزێ و دەپووکێتەوە. تەرمێك کە نیشانەی چەقۆ و نێزە و گوللەی پێوە



دیارە. داڕزین لەو کونانەوە بەرەو شوێنە ساغەکانی خۆ دەکوتن. هیچ ویژدانێك بۆ نووسەر غەیری ویژدانی داڕزین و پووکانەوەی خودی نووسەر لە نووسراوەکەیدا بەر چاو نییە. هەر وشەیەك هاندەرێکە تا تەشقی هاندان و هەر هەستێك هەوەسێکە لە ناخدا شەپۆل دەدا و هەر بڕگەیەکیش نێزەیەکە کە لە ڕۆح هەڵدەچەقێ.

نووسراوە سەرەتێکە لە نابووت بوون. هەڵبڕینی ڕۆحە بەرەو پێچەڵاوپووچییەکانی نابووتی. کێ دەتوانێ لەم کێشە و ئاژاوەیەدا بە ساغی دەرچێ؟ کێ دەتوانێ پاك بمێنێ؟ کێ دەتوانێ چرچولۆچە قووڵەکانی دەم و چاوی ڕۆحی لووس نیشان بدا؟ کێ دەتوانێ تەنیا نەبێ و سەر لە سنگی دێوەزمەکانی ناخی خۆی نەکوتێ؟ ژنان و پیاوان، ئەم ئاشنا و ڕۆشنایانە کە ئەو هەمووە لێمان نزیکن، لەو خەڵوەتەدا، لەو قوژبنە تەنگەی تەنیاییدا چەندە نامۆ دیارن. دەڵێی هەموو ڕاساون تاکوو ئێمە بەرەو بێگاری بەرن. پێکەنینە تاڵەکانیان لە ناخەوە دەبیستین. لە ڕوانگەیەکی ترەوە ئەوان خۆیان دەگۆڕن، خۆیان دەکەن بە دێوەزمەی ڕاساوی قوژبنی پێچەڵاوپووچی. ئەو کات لە ژنێك نزیك دەبینەوە کە وەها خۆی لە ئێمە دوورەپەرێز ڕادەگرێ کە دەڵێی لـە پشت شوورەیەك لە تێلدڕووی چڕوپڕ دانیشتووە و هەر هەنگاوێك کە لێی نزیك دەبینەوە تێلدڕووەکان سەر و چاو و دەست و سنگمان دەڕووشێنن. تازە ئەوەش سەرەتای کارە، دڵی ئێمە برینی ئەو

تێلدڕکانەی وەك گوڵێکی تازەپشکووتوو لە لا خۆشەویستە. ئەوەش هەر سەرەتای کارە، کوڕەکەشمان هەر ئەوە حاڵوباڵییەتی، هەروەها کچەکەشمان، دایکیشمان و باوکیشمان. ئەو دێوەزمە درەوشاوە و ڕاساوە، لە ناخی گۆڕدا گوڵاڵەی زامەکانی لە پەراوێزی دڵماندا گەشاوە ڕادەگرێ. دژوازی گەلێك لە ناخماندا هەیە کە تەنیا کاتی نووسین دەپشکوێن. دەمانەوێ دۆستەکەمان هەناسە نەکێشێ. نەیارەکەمان لە سەری یەکەم کۆڵان بە گەرموگوڕی لە باوەش گرین و ڕایموسین. دەست بکەینە ملی قاتڵی خۆمان و لەگەڵی بەرەو شوێنی داهاتووی کوژرانی خۆمان وەڕێکەوین. داوای لێبکەین بمانکوژێ. کاتێ کە چەقۆکەی تا بن دەسك لە سەر دڵمان دەچەقێنێ و دەیسووڕێنێ، بە خوێنەکەمان دوعای بۆ دەکەین. لەوپەڕی مەرگەوە خۆشەویستی و سۆزی دژوازیی خۆمان دەنێرین بە شوێن قاتڵەکەماندا. ئاشقی قاتڵەکەی خۆمان دەبین و سەرمان سوڕ دەمێنێ لەو هەموو ئەوین و خۆشەویستییەی. دەڵێم فلان منداڵ چاو گەورە و دەم و لێو باریکە، ئەوانە هەموو گرێبەستن و تووڕێك ناهێنن. لە ناخی ئێمەدا ئەوە بە شێوەیەکی دیکە خۆ دەنوێنێ. سیمپێچێکە لە یاد و خەیاڵ، کە جیهان بە دەوری ئەودا هەڵدەسووڕێنین. ژنێك سڵاومان لێدەکا، لە نووسراوەکەماندا جێی خۆی دەکاتەوە، بەڵام نەك بە شێوەیەکی قەراردادی، بەڵکوو بە شێوەی ڕەشەبایەك لە



دڵەخورپە و جنێو و جوانی و دەمارگرژی و چێژ و نابووتی. ئێمە سڵاوی ئەو بەرە و داهاتوو دەبەین. ئەو سڵاوە جەردەی خەیاڵی ئێمەیە. ڕێگرێکە کە لە داهاتوودا دەمانڕفێنێ و شکەنجەمان دەکا. وێنەی قاتڵێك لە ڕۆژنامەدا دەبینین" ئەو گرێبەستەکانی هەڵوەشاندۆتەوە، یاسای وە ژێر پێ ناوە، منەتمان بە سەردا دەکا، کە شتێکی پێداوین بە خۆڕایی. لە کردەوەدا، لە چارەڕەشی کردەوەدا ئێمە بە ناخی ئەودا ڕۆدەچین. نەك بچینە پێستی ئەوەوە، بەڵـکوو بە قووڵاییی ناخی ئەودا دەچینە خوارێ. خۆمان لە پشت ئەو سمێڵە و لە پشت شین هەڵـگەڕانی دەماری بەرچاوی و تووڕەیی بێبەزەییانەی نیگایدا دەبینین. دەبێ هەست بە دەستی ئەو بکەین. ئێمە کە کوژرانی مێشوولەیەك ئازارمان دەدا. دەبێ خەنجەری ئەو بگرینە دەست و لە هەموو دەمێکدا ئەوە ئێمەین نەك قاتڵەکە، نە ئەو ژنە، نە ئەو منداڵە، ئەوە ئێمەین کە دەکوژرێن و لەگەڵ خۆمان دەست تێکەڵ دەکەین و لەگەڵ خۆمان بە حورمەت و دڵۆڤانین و هەموو ڕۆژێ زامی دڵمان گەورەتر دەبێ و چڵك دەکا و بە جارێ دڵمان دادەوەشێنێ. نووسەر، نەخۆشێکە لە شتێخانەی وشەدا، ڕایدەپەڕێنین، دەڵێ: جەرگ و هەناوی ژنانیان بە ئاسماندا هەڵواسیوە. دایکم لە خوشکم دەچێ و هەر دووکیان لە ژنێك دەچن کە لووتێکی درێژ و شان و ملی باریك و پێستێکی سەرنجڕاکێشی نییە. چاکتری ڕادەپەڕێنین. دەڵێ

هاسکە هاسکی دنیا لە ناخی ئەو سێ کەسەوە دەبیستم. چاکتری ڕادەپەڕێنین، وشەی پێدەدەین. جەرگ و هەناوی ژنان، دایك و کچ و ژن، هەمووی قەراردادین، دەڵێ دەبێ سەفەر بکەم و ئەوانە لە خۆمدا بدۆزمەوە. کاتێ لە سەفەر دەگەڕێتەوە نایناسینەوە. مەسخ بووە. دەڵێی نینۆخەکانی ڕۆحیان دەرکێشاوە و بە تف نێوچاوانیان سواخ داوە. شانی دەگرین و ڕایدەتلێکێنین بەڵکوو سێبەری ئیبلیس لە ڕۆخساری بڕەوێ. بەڵام نا، ئەو حیکمەتی سووکایەتی بە باشی فێر بووە. پیر بووە، بۆیە زانایە. کوێر بووە، بۆیە بینایە. کتێبەکەی لێکدەکەینەوە، ناخی ئاشکرای لە نێو وشە پێچەڵاوپووچەکانیدا دەدۆزینەوە. نووسیویەتی: ژیانی ئاسایی مرۆڤ پیر دەکا و نووسین مرۆڤ زووتر پیر دەکا. هەر وشەیەك دەنووسێ ساڵێك پیر دەبێ. سەدەیەك بەرەو خولیایی، هەزارەیەك بەرەو وڕێنە دەچێتە پێش. بۆیە نووسەر نەخۆشیکە و وشە شێتخانەی ئەوە.

نووسین تەنیا لە هەناوی خولیایی و جینایەت و ترس و مەترسی و دڕدۆنگی و جنێو و خۆکوژییەوە دێتە دنیا. نووسەریش ئەوانە فەتح دەکا، بەڵام لە ڕاستیدا ئەوەی فەتحیان دەکا ئەو نییە. فاتحی ڕاستەقینە نووسەر نییە، بەڵکوو کتێبە. کتێب تەنانەت نووسەریش فەتح دەکا. وەك مۆتەکە سواری سنگی نووسەر دەبێ و لە ژێر قورساییی ترس و خۆفی خۆیدا لە نێوی دەبا.



ئەوە نووسەر نییە کە چارەنووسی کتێب دابین دەکا، بەپێچەوانە چارەنووسی نووسەر بە دەست کتێبە. ئەو لە کاتی نووسیندا بۆی دەردەکەوێ کە چ جۆرە مرۆڤێکە. بەر لە نووسین ژیانێکی فشە و پڕوپووچی بووە. کتێب ئەو دەدۆزێتەوە، لە تەنیاییدا، لە خەڵوەتی خولیاییدا، لە خەڵوەتی جەنایەتدا. ئەو کاتەش کە وا لە تەنیاییدا جنێو بە نزیکترین مرۆڤەکان دەدا، لەگەڵ دوورترین مرۆڤەکان بە دژی نزیکترینیان پیلان دادەڕێژێ. کاتێ چاو لە چاوی ئێوە دەبڕێ ڕێزتان بۆ دادەنێ، بەڵام لە ناخی خۆیدا بە سەر سەری ئێوەدا بەرەو مەترسی باز دەدا، کتێب ئەو دەدۆزێتەوە. لە چاوە خوێنساردەکانی بڕوانن. ئەو فێڵەبازی ناخە، بە تەواوی تەنزەکانییەوە، گەوجییەکانییەوە، شکەنجەکانی تەنیایی و شەونخوونییەکانییەوە، دیسان بە بیری خۆی و شێتخانە بوونییەوە، بە بیری ناخی نووسینییەوە. ئەو وریایی و فامی ناخی نووسراوەکەیە. ئەو مێژووی خۆی دەنووسێ یانی مێژووی ئیبلیس، یان ئیبلیسی مێژوو. نووسینیش قاتڵی ئەوە. چونکە تەنانەت نووسراوە دەستی لێبەردەدا و ئەو بەتاڵ دەکا و بە تەنیا جێی دەهێڵێ و لە ڕووناکاییی پێچەڵاوپووچی خۆیدا لە نووسەری تێدەپەڕێنێ و وەکوو تەڵەیەکی زۆر گەورە خەڵکی بێتاوانی پێوە دەبێ.

## ٢- زمانی ئازاد:

من دەبێ زمان ڕمووودەی خۆم بکەم: نووسەر دەڵێ: زمان کەرەسە نییە. تەنانەت ئامانجیش نییە. زمان مەرگە، مەرگێکی بەرەبەرە. نووسەر تەرمی خۆی لە زماندا دەنێژێ. لە زماندا لە نێو دەچێ و لە زماندا مەسخ دەبێ، دنە دەدرێ و دەمرێ و دیسان زیندوو دەبێتەوە و سەرمەشقی مردن و پەسڵان لە سەر زمان هەڵدەکۆڵێ. زمان بەرەو خولیایی و جینایەت و هەوەس و ناخ و مانا و مانای پێچەوانە و ڕەسەن و کۆنە و تازە و پیس و بەدفەڕ ڕادەدا. نووسەر لـە زماندا لەتوکوت دەبێ. عیبرەت وەردەگرێ و عیبرەت پیشان خەلك دەدا. قەفەز دەشکێنێ و یاخی دەبێ. دەنگی تووڕەی سەڵێتەیەکی سفلیسی، لە حەنجەرەی نووسەردا لەت لەت دەبێ. بانگی ئازادی فلاّن شۆڕشگێڕیش لە گەرووی ئەوەوە سەرڕێژ دەکا و پۆستاڵی هەموو داگیرکەرێك لە گەرووی نووسەردا گیر دەکا. قامچی هەموو جەللادێك چززە لە زمانی نووسەر هەڵدەستێنێ. زمان ئازاد کەن، جیهان ئازاد دەبێ. زمان بخەنە بەندەوە، جیهان دەکەوێتە بەندەوە.

من دەڵێم زمان بەرەو خولیایی ڕادەن، تەواوی چوارچێوە و یاسا و ڕێسا و گرێبەست و یەسقانەکانی تێك بشکێنن. تەواوی کێش و سەروا و قافیەکانی کە وەکوو کۆتری دیل وان، ئازادیان



بکەن. هەموو ئەندامی لەتوپەت بکەن و بە شێوەیەکی تر، بە شێوەیەکی وای بخولقێنن کە ئەدگاری ڕاستەقینەی ئێمە نیشان بدا، ناخی یەك بە یەکی ئێمە و ناخی نەتەوەیی ئێمە نیشان بدا. ئەم زمانە لە ڕادەبەدەر پاکژ بووە؛ ئیتر ئەم پاکژییە و ئەم پاك خۆنواندنە بەسە خودایە؟ ئیتر ئەم خاسە و زڕە و یەك سەر و دوو سەرە دەورگێڕانە بەسە خودایە! ئیتر ئەم عەرەبی و عەجەمی بازییە بەسە خودایە! ئیتر ئەم ئەدەب و ئەدیب و بەئەدەب خۆنواندنە بەسە خودایە! ئەم زمانە بەرنە وەتاغی خەوەکانتان. بیبەنە پای سێدارەکەتان، بیبەنە ناخی پیاوێك کە ملی بە پەتی سێدارەوەیە و تەنانەت توانای نییە تفێك لە چرووچاوتان بکا. ئەم زمانە بەرن بۆ ئەوپەڕی ناختان. بۆ سلوولەکانی جەللادی مێشکتان و بزانن لە سەر چ کێش و هەوایەك پیاو دەکوژن. بە چ سەروایەك ئەویینداری دەکەن و بە چ قافیەیەك بڕیار دەدەن خەیانەت بە نزیکترین دۆستی خۆتان بکەن. ئەو زمانە بەرن بۆ بەندیخانە. بۆ بەندیخانەی پڕ ڕەهەندی زەینتان و بزانن لەو قوژبنە کڕ و کپانەدا چ ڕادەبرێ. بزانن چوارچێوەی زمان لە نێو ئەو سلوولە ژێرخانییانەی مرۆڤدا، چ ڕێزمانێك و چ نەحوێك و تەنانەت چ زاراوەیەك و چ ئاهەنگێکی لێ وەدی دێ. دەبینی کە مانای گەلێ لە وشەکان ساختەچین. خوازەکان ڕووخەکن. وێچواندنەکان داگیرکەرانەن. دەبینی کە خەفەقان بە سەر زماندا

زاڵ بووه. دەبینی کە بەو گرێبەستانە و ئەم پڕوپووشانەی مانا، ناتوانی ڕزگار بی. ناتوانی ئەویندارى بکەی. ناتوانی تەنانەت بەندییەکی باش بی. ناتوانی تەنانەت ئیعدامییەکی باشیش بی.

ئەگەر دەتانهەوێ زمان ئازاد کەن لە پاڵ جێ و بانی هەر ئاشق و گراوێك، یان هەر ژن و مێردێکی قەراردادی زەفتێك دانێن و تەواوی بەشدارانی سیمینارێك یان کۆنگرەیەك ناچار بکەن کە گوێی لێبگرن و لەبەری کەن. خوار و خێچی دڵ و مێشکی پیاوکوژێك بکەن بە وشە، کاتێ کە وەکوو منداڵێکی بێتاوانی لێدێ، ئەو کات وشەکان بڵاوبکەنەوە. ئاوێنەیەك لەبەر زەمیری یەکێ لەو ئاشتیخوازانە دانێن کە خۆیان وەك مرۆڤێکی بەرێز و ئاکار جوان نیشان دەدەن. کاتێ کە دەبێ بە قاتڵێکی خوێنمژ، ئاوێنەکە بەرنە بەر چاوی خەڵك. بەم شێوەیە درۆزنێك لەکۆڵ زمان دەبێتەوە. لە چوارڕییانەکان لە قەرەباڵغترین کاتی ڕۆژدا ئەو کاتەی کە شۆفیرێکی ئاسایی قامووسێکە پڕ لە وشەی زیندوو، ژنێکی هەڵتووتەکاوی چرچولۆچ لە پەنا پیاوێکی لووت بەرزی ئیدارەیی، هەمبانەیەك لە وشەی بەرەڵلا، ئاوێنەیەکی زمان پاراو دانێن و ڕەسەنایەتی وشەکان ئاشکرا بکەن، دەبینن کە خۆتان هاوار دەکەن: بژی شۆفیری نەخوێندەوار، مەرگ بۆ خوێندنی باڵا! چونکە زمان، زمانی ڕەسەن و پڕ ئاهەنگ و زیندوو و پڕ لە هەیەجان لە حەنجەرەی شۆفیری کەم خوێندەوارەوە



دادەڕژێ، ئەم زمانەش شتێکە لە حەنجەرەی پیاوان و ژنانی خوێندەوار نایەتەدەرێ. لە مەیخانە و گۆڕەپانی قەتڵ و جەنایەت و تریاکخانە و قەحبەخانەکان، لە شوێنی گشتی و مەیدانی تۆپی پێ و هۆڵی گشتی و گۆڕستان، زەفت دانێن و ئاهەنگ و وشە و زاراوە کاتێ کە ساز دەکرێن و بە شێوەیەکی زیندوو دادەڕێژرێن و پوختە دەبن و پاشان دەمرن، تۆماریان بکەن. دەبینن کە زمانی دەورگێڕانی تەواوی شانۆکان داتاشراون. دەبینن کە زمانی زۆربەی مامۆستایانی قوتابخانە و مامۆستایانی زانکۆ و زۆربەی خوێندکارانی زانکۆ داتاشراون. زمانێکە کە ناتوانی پێوەی بژیی، ناتوانی ئازاد بی، ناتوانی هان بدرێی، تووشی دڵەخورپە بی، حاڵت بگوڕدرێ، بخولقێنی، برووخێنی، عازیەتبار بی، بمری، ئاوس بی، منداڵت ببێ و بە سەر منداڵەوە بچی. هەر کوێیەك هەیەجانی ڕاستەقینەی لێیە، زمانی زیندووشی لێیە. ئەگەر لە شوێنێکیش هەیەجان نەبێ یا بووبێ بە وشەگەلی سادە و بڕیاری و بە ئەدەبی تاقمێك مرۆڤی قەراردادی، دەبێ بەعەرزدا بچینەخوارێ و زمان لە پاڵ جەنایەت و مەرگ و شینگێڕی و ئیعدام و ئەویندارییدا بدۆزینەوە. هەر بەم هۆیەوەیە کە دەڵێم زمان بەرەو خولیایی ڕادەن. چڵك و پەڵەی گرێبەستی ئەخلاق و ئەدەب و ڕێزمان و کێش و سەروا لە سەر تەوێڵی پا کەنەوە. جا دەبینن لە بێ برانەوەی خولیایی و جینایەتدا سەرمەشقەکانی چۆن

دەدۆزینەوە و چۆن لە قوولایی پێچ و پلووچەکانی ناخی خۆمان و کۆمەڵگادا دێوی ئەم سەرمەشقانە سەر هەڵدەدەن و ترس دەهاوێنە دڵی ئەخلاقییەکان و بەئەدەبانی مێژوو و کەسانی قەراردادی مرۆڤایەتی دەکەونە لەرزین و جار لەگەڵ جار گەورە دەبن و بە ئاوری گەروویان ئەخلاق و مێژوو و قەراردادەکان دەکەنە سووتوو و خۆڵەمێش.

نووسەرێک کە لە پشت تێل درووی ناخی خۆیەوە دادەنیشێ و خۆی لە نێو نووسراوەدا دەدۆزێتەوە، لە نێو وشەدا، هەر وشەیەکیش دەبێتە چوارڕێیانێک کە هەر ساتەی ئەمبارێکی تەقەمەنی تێدا دەتەقێتەوە. نووسەر ئەو ئاژەڵە دڕ و هارەیە کە لە پشت میلەی قەفەسەوە تووشی بێئۆقرەییەک دەبێ، وەها سەر دەکوتێ بە میلەکاندا و خۆیان پێدا دەدا، کە هەزاران دێوی دەروونی ڕزگار دەکا. نووسەر دەڵێ: من ساتێک بەر لە مەرگم و ساتێک بەر لە جەنایەتی ڕاساوم و ساتێک لە ساتەکانی مەرگم چۆن بەو وشە قەراردادییانە، چۆن بەو وشە قەحبانە، چۆن بەو شوبهاندنە بۆژۆیانە، چۆن بەو ئاهەنگە دەستاودەست کردووانەی ئێوە بەیانی دەکەم؟

من زمانێکی ترم دەوێ، زمانێک کە سەرمەشقی زەینی من بێ کاتێ کە زەینم دەڕزێ، سەرمەشقی دڵم بێ کاتێ کە لە ناخەوە دەتەقێمەوە، نیشانم بدا. پێچی ڕیخۆڵەکانم کاتێ کە لەبەر



شەیدایی و خولیایی ئارەقەی کردووە، نیشان بدا. ناخی من، ناخی دڕندە و کوژەری من چۆن دەتوانێ کراسێک لەو کراسە شڕ و کۆنانەی ئێوە بەقەرز وەرگرێ؟ دەروونی من دەبێ سەرمەشقی کەلامی خۆی بۆخۆی داینێ و ئەم سەرمەشقی کەلامییە دەبێ من لەو ساتەدا نیشان بدا کە وەک زەروو تینووی خوێنم. ئەوانەی کە بە گرێبەست نێوبژیکاری دەکەن، نیوەشەو دەڵێن: تەماشا کەن شەیتان لەم سەربانەوە بۆ ئەو سەربان باز دەدا. بە سەر ئاسمانی شاردا دەفڕێ! ئەوانەی کە بەزەییان بە خۆیاندا دێ و دایمە خەریکی گریانن و دەکوڕووزێنەوە، دەڵێن: تەماشا کەن ئەو فریشتە تاوانبارە کە لە بارەگای ڕزگاری خودا وەدەرنراوە و ئێستا لە سەرلێشێواوی دا دەخولێتەوە.

بەڵام نووسەر بێ ئەوەی هەرا و هاواری ئەو سەرکێشانە ببیسێ لە تەنیایی پێچەڵاوپووچ و پووکاو و پیرۆز و سەر سوڕهێنەری خۆیدا، لە هەناوی هەتاوی ناخی خۆیدا بیر هەڵدەکەنێ و کاکێشانە دیلەکانی نێو سلوولی شێدار ئازاد دەکا و شەڕگەکانی ناخی کە لە زەینیدا بوونەتە ئەنتیکەخانە، بە ساندانێکی تازە دەبووژێنێتەوە. لە بانگهێشتنی چەتەکانی ناخیدا بەشداری دەکا و لە قاپێکدا نانیان لەگەڵ دەخوا و لەگەڵ هەر جووڵانێکی، نووکی قەڵەمەکەی تیژتری دەکا و زیاتر سێرە لە دڵی خۆی دەگرێ. ئیتر کاغەز لە بیر دەباتەوە و جۆرێک دەنووسێ

که دەڵێی بە قەڵەم ژەهر دەکاتە دەماری خۆیەوە. هەمیشەش خۆی ساتێك بەر لە هاوار کردن و ساتێك بەر لە خولیایی و ساتێك بەر لە مردن نیشان دەدا. نووسەر زمانی خۆی لە ژەهر هەڵدەکێشێ و تەرمی خۆی لە زماندا بە جێ دێڵێ و تێدەپەڕێ.

هەموو وشەیەك دەبێ تەنیا باس لە چەشنێك وەفاداری بکا و ئەوەش وەفاداری بە بێقەراریی خولیابوونە. قوڕ بە سەر ئەو نووسەرەی کە وەك پشیلەیەك دەچێ کە ئەسلێکی ئەخلاقی وەك مشك بە دەمەوە دەگرێ و دەچێتە جێیەکی چۆڵ و پەیتا پەیتا لە بەینی ددانیدا ڕێکی دەگوشێ. ئەسلێکی ئەخلاقی لە مشکێکی تۆپیو بۆگەنترە. وشە بۆ ئەوەی زیندوو بێ، دەبێ وەفاداریی خۆی بۆ هەیەجانی خولیایی، بە دەنگێکی بەرز ڕاگەیێنێ. نووسەر لەو تاوویاوەی خولیاییدا دەبێ وا هێمنانە دڵی خۆی لە ڕکەی سنگی دەرهێنێ، وەك ئەوەی کە گەڕابێتەوە بۆ ماڵێ و کەوشەکانی داکەنێ و بخزێتە پێخەفەکەیەوە. چاوی خۆشی هێندە خوێنساردانە دەرهێنێ وەك ئەوەی چاویلکەکەی لە چاوی دادەکەنێ. ئەمجار دەبێ وەك دێوێکی تازە لەخەو ڕاپەڕێت و هێز وە بەر خۆی بنێ، یان وەك سەربازێك کە فەرمانی هەڵمەتی پێدەدرێ دڵی وا بنێتەوە جێی خۆی وەك ئەوەی کە کەوشەکانی لە پێ دەکا. چاویشی وا بنێتەوە هێلوونی چاوی وەك ئەوەی کە دووربینەکەی ئەم بارەوبار بکا بۆ دۆزینەوەی شەڕگەی دوژمن.



نووسەر نابێ لە بیری ڕزگاری خۆیدا بێ. ئەو دەبێ بە قاقا و شادییەوە بەرەو پێش بڕوا و کاتێ کە تاپۆی خەونەکانی سواری شانی دەبن: کاتێ کە فریشتەکانی وڕێنە و ڕاواندن لە دەوروبەری سەما دەکەن، کاتێ کە دەریاکان دەبنە تراویلکە و کاتێ ئاسمان مەنجەڵێکی سەرەونخوونی قوڕقوشم و پۆڵایە و هەموو دێڕێکی نووسراوەکەی ڕووباری ژەهر و جنێوە، کاتێ کە هەر ساتێکی زیاتر لە ساتی پێشووی لە قاقڕێکی بێکۆتاییدا نوقم دەبێ. بەڵام ئەو دەبێ لە تەواوی ئەو ساتە توندوتیژانەدا بڕواتەپێشێ، سەرانسەری کوورەی ناخی خۆی وەك قابیلێکی نفرینکراو بپێوێ و کاتێ کە منداڵەکەی لە ئاسۆی شەوزەنگەوە تف لە ڕوخساری دەکا و ئەڕواحی تاریکی هوڕا دەکێشن، کاتێ کە ژنەکەی وەکوو کاروانسەرایەکی مۆمیاییکراو سەد مزڵ دەبڕێ، کاتێ کە تەنانەت تاقە دۆستێکی نییە ـ چونکە هەموو گیرۆدەی خێر و سوودی تەنیایی خۆیانن و دۆستایەتی شتێکی مەحاڵە ـ لە هەموو ئەو بارودۆخە ئەستەمانەدا دەبێ بەرەو پێشەوە بڕوا و وەکوو منداڵێك کە لە ترسانا لە تاریکەشەودا دەست دەکا بە گۆرانی گوتن و لە نیوەی گۆرانییەکەیدا دەقیژێنێ، نووسەر دەبێ خولیاییی جیهانێك، کە وەفادارە بە خولیایی و هەیەجانی خولیابوون، بە وشە ڕاگەیێنێ.

نووسەر دەپرسێ: ئاخ ئەی دەمارە خوێنبەرە خۆشەویستەکانی من، ئیتر دەتانهەوێ چم فێر بکەن؟ ئەی دەمارە کۆن و تاویاو گرتووەکان، ئەی دەمارە نوێکانم کە لە گەڕیان دان، ئیتر چ ڕێگایەکی تازەم وە بەر دەنێن؟ نووسەر ئەم کاناڵە دەمارییە دەکاتە کاناڵێکی کەلامی. لەو بەستێنەدا غەریزە و ڕەنگ گۆڕینی خوێناوی عاتیفە، لەو بەستێنەدا خەیاڵی شێتی و جینایەت و ئەندێشەی لێوڕێژ لە ڕووناکی لە گەڕیان دان. نووسەر کەسێکە کە پێچوپلۆوچەکانی دەماری مێشکی بکاتە وشە. دەڵێ هەستن دەی بۆ پێشەوە، بۆ پێشەوە. تاکوو نووکی ژەهراویی خەنجەر، خەنجەری قەڵەم لە سەر شادەماری ڕادەوەستێ و بە ڕقەوە تێی هەڵدەچەقێ. ئاخر چی بە قەد شادەمار لە دڵ و مێشکی ئینسان نزیکە؟ نووسەر ئەو شادەمارە دەبڕێ و هەڵێدەدڕێ. کەسێك کە هەزار مۆجزەی لە باخەڵدایە، خۆی لە نابووتییەکی بەر لە مردندا وێڵ دەکا و لە پووکانەوەی وێڵ بووندا چاو هەڵدێنێ و پاشان دەنووسێ. بە چ زمانێك؟ بەو گرێبەستانەی ئێوە لەم بەستێنەدا ناتوانێ هیچ شتێ بدۆزییەوە. ئەوە کەندەکارانی واژەچنن، قارەمانانی بەڕێزی ئیدئۆلۆژییە قەراردادییەکانن، شایەرانی وڕێنەچین، کە قەڵەم بە گۆچان دەزانن، ناوێرن تەنانەت بۆ ساتێك پێ بنێنە هەرێمی گەندەڵی جەستە و ڕۆحی خۆیانەوە. تەنیا کەسێك زیندووە کە تەرمی ڕزیوی خۆی لە



بەرانبەر خۆیدا ببینێ و بێئەوەی بە دەسرە لووتی خۆی بگرێ بە چەقۆی قەڵەم دەست بکا بە تاشینی ئەو شوێنە ڕزیو و بریندارانەی کە دەبنە هۆی ڕزین و داوەشانی تەرمەکەی. نووسراوە ڕوانینێکی بەرانبەرە بۆ دزێوی و پەستی و بێشەرمی. نووسەر هەقی نییە خەڵکی بە پەست و گەمار و دزێو بزانێ. ئەوە هەڵاتنە لە دەست خۆی. نووسەر دەبێ سووکی و چرووکی خۆی بسەلمێنێ. عیرفانی ڕاستەقینە یانی ناسینی بێ شەرمی و بێئابڕوویی خۆت. ئەو ناسینەش زمانێکی جیاوازی دەوێ. ئاهەنگێکی جیاوازی دەوێ. زمان دەبێ بە هۆی وڕێنە و غەریزە و خەون و خەیاڵ و پەشیمانی و گومان و دڕدۆنگی و نەخۆشی و شێتی دەستی بە سەردا بگیرێ. زمان دەبێ بە پیسی و بێشەرمی و خوێن و خوێنی مەییو و شۆڕشی تووڕە و ڕەسەنی سلوولەکانی لەش و هەڵقوڵانی لە ناخی زگپڕی، ئالوودە بێ. ئەم زمانە شۆڕشگێڕە دەبێ لە هەناوی ڕۆح و خولیا بوونەوە دەرهێندرێ. سەمای سێحراوی وشەگەلی ئەم زمانە، ڕێزمانی ئەوە، هێرشی سێلاو ئاسایی وشە ئاهەنگی بۆ دادەنێ.

لە پەڕاوێز و پاشان جوولاّن و سەرهەڵدان و لە ڕاوەستان و پاشان ڕەخنە کردن و تەنینەوە و شوێندانانیدا، ئەم زمانە دەبێتە زمانی ئەو شەیتانەی ناخ. شەیتانێك کە لەبەر درگاکانی دڵدا کێشکچییە. شەیتانێك کە هەناسەی بە نێو دەمارە

خوێنبەرەکاندا ئەدەمێنێ و لە سەر خرتکەکانی ڕۆح نیگابانی دەدا. شەیتانێك کە مێشکی پژاو دەکاتە چراخان و لە هەر کونێکەوە بەرەو جیهان دەڕوانێ. جیهان قووت دەدا و ئاوس دەبێ. شـەیـتـانـێـك کـە ڕۆح لە نێو خۆیدا دەتوێنێتەوە.

زمانی نووسراوە دەبێ گەلاڵەی خەیاڵی ئەو شەیتانە بێ. هەر کەسێ ئەم شەیتانەی ناخی نەبێ نووسەر نییە، بارزگانی ئەدەبیاتە. کەسێك ئازادە کە ئەو شەیتانە خوێنییەتی، گۆڕانی ئەو شەیتانە بەیان بکا. نووسراوە بە زمانی سیحراوی و شەیتانانەی خۆی، نووسەرەکەی لە کاتێکدا نیشان دەدا کە خەریکە دەبێتە شەیتان. زمانی ئاسایی، زمانی ڕووناکی و زمانی ڕۆژ و هەتاو ناتوانێ زمانی ئەو شەیتانە بێ. شەیتان لە تاریکیدا، لە قووڵاییدا، لە شەوەزەنگدا، لە خەڵوەتی پڕ لە پیلان و دەهۆ و نابووتیدا دەژی. شەو زمانی شەیتانە، ئەو شەیتانە ئازاد کەن، زمانی ڕاستەقینە ئازادە تا کاتێك کە هەموو وشەیەکی بە خوێنی ئەو شەیتانەی ناخ ڕمووده نەبێ، ئێوە هێشتا ئەو زمانەتان ئازاد نەکردووە. لەمەڕ ئەو شەیتانەی ناختانەوە ئەرخەیان بن.

## ٣- نووسراو و مەرگ:

"نووسراوەکانی من لەگەڵ دڵەخورپە هەڵسوکەوت دەکەن. هێندێ کەس بەم هۆیەوە ڕەخنەیان لێگرتووم. لە میوانییەکدا پیاوێکی بەنێو ڕۆشنبیری ئینگلیزی لێی پرسیم من بۆچی هەمیشە لەمەڕ دڵەخورپەوە دەنووسم؟ وادیارە نووسین لەمەڕ دڵەخورپەوە جۆرێك لادەرییە. ئەم ڕۆشنبیرە دەیویست بزانێ کاتێ کە منداڵ بووم باوکم لێی داوم. یان دایکم تۆراوە و منی لەگەڵ ژیانێکی تاڵ بەجێ هێشتووە. بەو ڕۆشنبیرەم گوت بە پێچەوانە، سەردەمی منداڵیم زۆر شیرین بووە. ئەمجار ئەو ڕۆشنبیرە پێی وابوو ئیتر بەڕاستی لادەرتر لە پێشووم. هەر خێرا میوانییەکەم بەجێ هێشت و سواری تاکسی بووم. لە شووشەی نێو تاکسییەکەی نێوان من و شۆفیرەکەدا سێ ئاگاداری چەسپابوون. لە یەکیاندا یارمەتییان ویستبوو بۆ کوێرەکان. دووهەمی بۆ هەتیوان و سێهەمی بۆ پەنابەرانی شەڕ. پێویست نییە نووسەر بە شوێن دڵەخورپەدا بگەڕێ. دڵەخورپە تەنانەت لە نێو تاکسییەکانی لەندەنیشدا لچت لێ هەڵدەقورتێنن."

سەیرە کاکە سەیرە! ئەو ڕەخنەگرە ئەخلاقییانە جۆرێ لەمەڕ نووسەرانی دنیاوە دەدوێن کە دەڵێی بە فەرمانی توندی "ئینتلیجێنس سێرویس" بۆ شیکاری و ڕاڤە و ڕوونکردنەوەی



لەنێوچووی ڕۆحی مرۆڤـ دەست بە کار بوون. ئەم ڕەخنەگرە ئەخلاقییانە جۆرێك باسی "جوێس" دەکەن کە دەڵێی مەچەکی ئەو حەزرەتەیان کاتی وەرێخستنی کۆدەتایەك گرتووە. وەکوو شێرپەنجەیەکی بەدخیم دایدەپەلۆسن. جۆرێك باسی "بیکێت" دەکەن کە دەڵێی کارتی ئەندامەتیی ڕێکخراوەیەکی سیخوڕییان لە گیرفانی دەرکێشاوە. "فۆکنێر"یش وەها دەکەنە عیفریتێکی دزێو کە دەڵێی بێچارە لە تالانی کانگەی ئەڵماس و ئاڵتووتی "کاتانگا"دا بەشداریی کردووە، یان لە پشت سەری بەرخەبەبەی تا بن گوێچکە دەرپەڕیوی "چومبەی مەلعوون"ەوە دەم و چاوی فێلاوی و سیخوڕی فۆکنێریش وەك سێبەرێکی قوڕقوشمی لە سەرمایەداریی جیهانی وەدەرکەوتووە.

ئەخلاق چییە؟ کە ڕەخنەگرانی ئەخلاقی ئاوا ملی خۆیانی بۆ دەشکێنن؟ قەحبەیەکی دەستاودەست پێکراوە لە سەر دەمێکەوە بۆ سەردەمێك، لە سەرڕانی سیاسەتبازانی جلف و گەمژە” عیفریتەیەکی بە شەڕەفە کە بە هۆی ئەوەوە کڵاوی شەرعی دەنرێتە سەر بێئابڕوویی و شەرمەزاری. بەستۆکەیەکی پایەبەرزە کە لە دەمی هەر سیاسەت وانێکدا بە جۆرێك دەم لە یەکیەتی دەکوتێ. بەکرێگیراوێکی چەنەوەرە کە خەرمانەی بڵێسەیەکی درۆیینە لە دەوری سەری دەگرێ. ئەم ئەخلاقەش دەتوانێ چ پێوەندییەکی ببێ لەگەڵ زەینی داهێنەرانەی فلان نووسەر کە

دەیهەوێ لە پێچوپلۆوچی ناخی خۆی تێپەڕێ و هەموو پردەکانی پشت سەر و بەردەمی خۆی ڕووخاو دەبینێ؟ ئەم ئەخلاقە چ پێوەندییەکی هەیە لەگەڵ کەسێك، کە ناخی کۆمەڵگایەکی دیار و بەرچاو لە گەندەڵی و نابووتی و تەماح و چاوبرسییەتی و ئابڕووچووی تێدایە؟ تاکەکەسی: کۆمەڵگایە، تاقمێکی دابەش کراوە بە سەر "چاکە و خراپە"ی قۆڕدا و تاقمێکی دابەش کراوە بە سەر "خێر و شەڕ"ی پێکەنینیدا. ئەم ئەخلاقە چ پێوەندییەکی بەو تاکەکەسەی بێ کەموکووڕیی ناخەوە هەیە؟ تاکەکەس خۆی دیالیکتیکێکی دیاری دەروونییە. داوەری فێلاوی و قەراردادی و ئەخلاقی پڕ لە ئامۆژگاری چ پێوەندییەکیان هەیە بەو دیالیکتیکەی هەڵقوڵاوی ناخەوە؟ حاڵ و باڵی ئەو ڕەخنەگرە ئەخلاقییانە زۆر سەیرە!

لە دنیای ئەمڕۆدا شتێك بە نێوی ئەدەبیاتی ڕاست، بوونی نییە. ئەدەبیاتی ڕاست مرد و ڕۆیشت. خودا بیبەخشێ یان بە لەعنەتی بکا، هیچ پێوەندییەکی بە ئێمەوە نییە. تازە ئێمە سنوورمان بەزاندووە و دنیا ئیتر بە ئێمە ڕاست نابێتەوە. ئەو لیبرالیزمە باوکانەیەش دارزی. منداڵەورکەی "ڤێتنام" نیشانیان دا کە فێڵەبازترین "ئیزم"ی جیهان هەر ئەو لیبرالیزمە بوو کە سەردەمێك سیاسەتی ئیستعماری فەڕانسە و ئینگلیس لە دواوە سنگیان بۆ دەکوتا و سەردەمێکی تریش "جانسۆن". ئەوانە



دەیانەویست جیهان بە چەپ و ڕاست دابەش بکەن. ئەگەر بڵێین بە تەواویش نەمردووە، لانیکەم دەتوانین بڵێین کە شتێك بە نێوی ئەدەبیاتی ڕاست، بوونی نییە. لە ڕۆژئاوا ئێستا تەنانەت دەست ڕاستەکانیش بوونەتە چەپ دەست، چ بگا بە خودی چەپدەستەکان. لە ڕاستیدا نووسەری ئەمڕۆ لەگەڵ هەموو شتێ چەپە، تەنانەت لەگەڵ خۆیشی. تەنیا ئەدەبیاتێك کە دەمێنێتەوە ئەدەبیاتی چەپدەستەکانە. ڕاست تەنیا دەتوانێ بە قەد و باڵای فاشیستەکاندا هەڵبڵێ. چونکە شایەر ڕۆژیان نەماوە و هەموو فاشیستەکان بە خۆیاندا هەڵدەڵێن و بە خەیاڵ لەگەڵ خەڵکییانە و ئەوەش ڕەنگە جۆرێك ئەخلاق بێ و ڕەخنەگرانی ئێمەش هەندێ جار حاڵ و هەوای ئەو فاشیستە لیبراڵ و ئازادیخوازانەی ڕۆژئاوایان هەیە.

نووسەرانی گەورەی ڕۆژئاوا جێژنی لاواز بوونی ڕۆژاوایان گرتووە، هەقیشیانە. جنێودان بە "جۆیس" و "بیکێت" و شانازی کردن بە لیبرالیزمی ڕۆژاواوە، شانازی کردنە بە ژیاری پۆکاوی ڕۆژاوا. یان شانازی کردنە بەو بەشەژیارەی ڕۆژاوا کە بە جارێ دارزیوە. ئەم نووسەرانە ژێرخانی ڕۆژاوایان نیشان داوە، ئەم شەوقە گەمارە و ئەم مەسخ بووە شەل و کوێر و گەڕانە و ئەم تاریکستانە بێ کۆتاییە و ئەم زەینە شڵەژاو و نوقسانە، ئەم هەوڵە گەوجانەیە، ئەم خۆ قیت کردنەوە قۆڕانەی نێو خمخۆرك،

ئەم ونبوونەی زمانی مەنتق لە بێ مەنتقی پەیتا پەیتادا، ئەم بەردەوام بە دەوری خۆدا سووڕانە. ئەم نەتوانین و نەگەیشتنانە، هەوڵی دیسان و دووبارە و دەبارە و سەدبارە، ئەم بەردەوام تلانەوە بەرەو بیر چوونەوە و لەتلەت دیتنی جیهان، ئەو دنیایەی ژێرزەویی ڕۆژاوایە کە سیاسەتوانان ڕووپۆشێکی هاورێشمینیان بە سەردا کێشاوە. هاورێشمێك لە "بورۆکراسی" و وردبینی و بیری "میلیتاریستی" کە لە هەمبەر وڵاتانی ڕۆژهەڵاتا ڕایانگرتووە، تاکوو هەرکەس بە نۆرەی خۆی شتێکی لێ هەڵکڕێنێ. بەڵام دەبێ پیاو زۆر چاو قایم بێ و فریوی ئەو هاورێشمە ڕواڵەتییە نەخوا. جیهانی دەروونی ڕۆژاوا دزێوە و کەسێك بێفێڵ و گزەیە کە بە سەر ئەو دزێوییانەدا زاڵ بێ. تەنیا دەبێ لە دوورەوە ئافەرین بە "بیکێت" و"یۆنسکو" و دیتران بڵێین و چەپڵەیان بۆ لێدەین تاکوو زیاتر بە ناخی کۆمەڵی خۆیاندا بچنە خوارێ و هەموو شتێك بخەنە بەرچاو.

"هارۆلد پینتێر" سەبارەت بە بیکێت دەڵێ:"هەرچی زیاتر دەچێتە پێشێ پتر لەگەڵ چێژ و تامەزرۆیی من گونجاوە. من فەلسەفەم ناوێ، وتار و بناغە و بیر و باوەڕی دەرباز بوون و وەڵامی پرسیار و حەقیقەتەکانم ناوێ. هەوڵی پڕ کەموکووڕیم ناوێ. ئەو نەترس ترین و بێ بەزییترین نووسەرێکە کە ئەمڕۆژانە خەریکی نووسینە. هەرچەند زیاتر دەم و لەوسم لە پیسایی



هەڵساوێ، بەو ڕادەیە زیاتر ڕێزی لە لای من هەیە." هەقیقەتیش ئەمەیە کە ئەو کەسێکی تەواوە. دیالیکتیکێکی دیاری دەروونییە. شێوازی ئەو تەواوی مێژووی لە نێوچوون و توانەوەی ژیاری ڕۆژاوایە. چ هۆیەکی هەیە کە من و ئێوە پێمان وایە کە خەیانەت بە مرۆڤایەتی دەکا. چونکە مرۆڤایەتیی خائینی ڕۆژاوا بە چاکترین شێوە دەنوێنێ؟ مرۆڤایەیتی ڕۆژاوا، مرۆڤایەتیی سەرمایەداریی ڕۆژاوا خەیانەتی بە مرۆڤایەتیی کردووە. نووسراوەکانی بیکێت و ئەوانەی وەك ئەو دەنووسن نواندنی ئەم مرۆڤە خەیانەتکار و خەیانەت پێکراوانەیە. کۆتایی ئەوان بەرخۆدان لە شەخسە پەڕۆی بێ مۆجزەی لیبرالیزمی ڕۆژاوایە. ئەم ڕەخنەگرە ئەخلاقییانەی ئێمە بەڕاستی مرۆڤگەلێکی گەوج و وڕێنەبێژن. بەڕاستی شەڕگەی ئەم ڕەخنەگرانەی ئێمە، شەڕگەی نەزانی و وڕێنەبێژییە. ڕەخنەگرانی لایەنگری ئەخلاقی لیبرالیستی بناغەی کاری خۆیان لە سەر ڕیا داناوە. بەڵام نووسەری ڕاستەقینەی ئەمڕۆ، لە هەر بوارێکدا ساتێك بەر لە مەرگی خۆی نیشان دەدا. ڕووبەڕووی خۆی دەنوێنێ. سات لەگەڵ سات نزیکتر دەبێتەوە لە مەترسی، مەترسیی کۆمەڵایەتی، مەترسیی تاکەکەسی، مەترسیی دڕدۆنگی، مەترسیی یەقین، مەترسیی هەڵمەت، هەر لەو تەنگژە پڕخۆف و سامناکەدایە کە ئەو پانتایی ڕوانگەی خۆی نیشان دەدا. هەڵبەت ئەو نایهەوێ

خۆی بنوێنێ و هەوای لێ بڵیند بێ. ئەوە تەنیا لایەنگرانی ئەخلاقن کە پانتایی ڕوانگە و تەندروستی دەروون و شکۆی مرۆڤانە و بەرزیی تەبع و شعووری ڕاستەقینە و مەزنایەتی و زانایی خۆیان دەنوێنن. نووسەری ڕاستەقینە هەموو ئەو خسڵەتانەی هەیە. ئەوانەی کە شانازی بە مرۆڤ بوونی خۆیانەوە دەکەن سیاسەتوانانی ئەدەبین و پلە و پایەشیان لەپاڵ سیاسەتواناندایە. ئەدەبیات گۆڕەپانی سووکایەتییە، ئەدەبیات ڕاستەقینە چۆك دادانە لە هەمبەر ساتۆردا، تەنیا شتێك کە لای مرۆڤی ڕاستەقینە و لای نووسەری ڕاستەقینە بوونی هەیە. بریقەی دەمی ئەو ساتۆرەیە لە ڕوانگەی مرۆڤایەتییەوە. نووسەر دەبێ بپرسێ کەنگێ دەکوژرێم؟ لە کوێ دەمرم؟ ئەو کاتە خوێناوییە کەی دەبێ؟ کەی بەرەو مەرگ دەتەقێمەوە؟ تەنیا گەمژەکان لەو ساتە لە ژیاندا، یان لەو ساتە لە مەرگدا بیر لە ئەدا و پایە و ئەخلاق و منەت و مەرایی کردن دەکەنەوە و دەبنە سەرباری خەڵك، دەروەست بوونی ڕاستەقینەی نووسەر، جا چ نووسەری وتارێکی سیاسی بێ، یان شاعیری شێعرێکی ئەویندارانە یان چیرۆکێکی دەروونی، یان دەرهێنەری شانۆیەکی قەشمەرجاڕی ڕاستەقینە، لەو ڕوانگەیەدایە کە ئەو نووسەرە دەیخاتە ڕوخساری مەرگەوە.



ژیان بەڕاستی لەو ساتەدا چەندە شیرینە، چەندە مۆجزە شێوە و چەندە کارەساتبار و چەندە زیاتر لە هەمیشە عەینی و زەینی و ڕاستەقینە دیارە. وا دیارە کە جلوبەرگی شڕ و تەنانەت گەڵای وشك و قوڕەسواخ و دەنگی ناخۆشی قەلەڕەشەش بۆ پارێزگاری دەبن. تەنانەت ناچیزەترین بوونەوەرانی دنیا و تەنانەت ئەم کرمانەی کە لە نێو کاسە سەرماندا جمەیان دێ، تەنانەت گیان لەبەری مجرۆی نێو خەونەکانمان. تەنانەت ڕووتی و ئابڕوو تکانمان. تەنانەت شووخاڵی ئەو قامچییانەی کە زاڵمان لە نێو شانیان ڕاکێشاوین. لەوکاتەدا ڕوانین لە چاوی خوێن تێزاوی مەرگ، خۆشەویست دێتە بەرچاو. ئایا بەختەوەریی ڕاستەقینە بوونی هەیە؟ نا، قەت قەت! لەو بارودۆخەدا نە بەختەوەری کۆمەڵایەتی بوونی هەیە، نە بەختەوەریی تاکەکەسی و نە بەختەوەریی خودایی! تەنیا خۆڕاگری و مەرگ بوونیان هەیە. تەنیا ژیان بوونی هەیە و مەرگ بوونی هەیە. ژیانیش ئەو شتەیە وا لە هەمبەر مەرگدا ڕاوەستاوە و بەرخۆدان لە nامووس و بوونی خۆی دەکا. نووسەر ژیانە و تەنیا دەروەستییەك کە هەیەتی بەرخۆدان لە خۆیەتی لە هەمبەر مەرگدا. ڕۆژانی خۆش، ڕۆژانی سەما و هەڵپەڕکێ، ڕۆژانی ئەوین و شادی، ڕۆژانی جوانی و خۆشەویستی، ڕەحم و بەزەیی، ڕۆژانی ڕۆژ و تیشك نایەن و خۆشەویست نابن ـ ئەگەر تەنانەت لە درگاش بێنە ژووری ـ مەگەر ئەوەی کە نووسەر

له نامووسی ژیانی خۆی له هەمبەر مەرگدا پارێزگاری بکا. ژیانیش لەو بارودۆخەدا هەست کردن بە دەستی ئەوەڵ و بێ سۆنگەی مەرگە. مەرگی کۆمەڵایەتی، مەرگی تاکەکەسی، مەرگی جوانی، تەنیا کاتێك ژیان ڕزگار دەبێ کە مەرگی ڕاستەقینەی خۆشەویستانی ژیان: ئەوین، جوانی، ڕۆح، کەس و کۆمەڵ بەبێ هۆ و بەڵـگە هەست پێبکرێن. تەنیا کەسانێك پاکن کە ددان بە خیانەتی خۆیاندا بنێن. ئەخلاقییەکان بەر لە هەموو کەس خەیانەت بە خۆیان دەکەن، بێ ئەوەی ددانیشی پیابنێن خۆیان بە هەقدار دەزانن. ئەگەر کاژی دروشمەکانیان و پێستی ڕەوشت و بیروباوەڕیان داماڵی، گەمژەگەلێك وە دەر دەکەون ئەژنۆچەماو لە هەمبەر گەلحۆیی خۆیاندا.

ئەوانە تەنانەت ناتوانن داوای لێبوردن لە خۆشیان بکەن. چ بگا بەوەی کە ئێمە ڕزگار بکەن. دڵی چکۆڵە کوا جێگای ئەوینی بێ سنووری تێدا دەبێتەوە. مێشکی چکۆڵە کوا دەرفەتی گەڕانەوە بۆ ناخی هەیە. ئاسمانی ئەوان هێندە نزمە سەریان لە بنی توند بووە. ڕوانگەشیان بست بە بستی گۆڕەپانی خورافات و پڕوپووچی زووتێپەڕە. چونکە ئەخلاق تێدەپەڕێ ژیان دەمێنێتەوە، مەرگ دەمێنێتەوە، ئەوین دەمێنێتەوە. شەڕ و هەوس دەمێننەوە و نووسەر باس لەو مانەوانە دەکا. نەك لە تێپەڕ بووەکان و ڕەوشتی ڕێبواری ئەخلاق.



حاڵ و باڵی ئێمە، حاڵ و باڵی جیهانە؛ ئیتر ڕاست نابێتەوە. مرۆڤی سەردەمی ئێمە لە ساتەکانی بەر لە تەقینەوەی جیهاندا ڕاوەستاوە. دەبێ شایەدی بۆ لە نێو چوونی دنیا بدا. تاکوو ڕۆژێك ڕەنگە ڕوون بێتەوە کە لەنێوچوون بوونی نییە. یان شتێکیش بە نێوی دژەلەنێوچوون بوونی هەیە. بەڵام ئێستا لە بارودۆخی لەنێوچووندا دەبێ شایەدی بۆ لەنێوچوون بدەی. منیش پێمۆایە نووسەری ئازا و بەجەرگ لـە جیهاندا کەسێکە کە خۆی بکا بە لەنێوچووی دیاری کۆمەڵگا و خۆی بەکردەوە بەرەو نابووتی بکێشێ. فیدای کۆمەڵـگاکەی بێ و ئەوساتەی بەر لە تەقینەوە بۆ خەڵکی جیهان بنوێنێ. بەم شێوەیە نووسراوە نیشاندەری ناخی برینداری مرۆڤـ دەبێ. نووسراوە نەشتەرێك دەبێ کە لە سوورەکوانێکی پڕ لە چڵك و کێم و خوێن ڕۆدەچێ. سروشتیشە کە وشەی نووسراوە لەگەڵ جنێو و قسەی سووك و لێدان و هەیەجان و ئابڕووچوون و تاوان ئاوێتە دەبێ. ئەخلاقییەکان نوسخەی ئەدەب دەپێچنەوە و نووسراوەی ڕاستەقینە لە بارودۆخی ئێستادا غەیری لافاوێك لە قسەی تاڵ و جنێو نییە و نابێ. چونکە شەتاوێك لە چڵك و کێم قەت نابێ بۆنی عەتر و گوڵاوی لێ بێ. ئەگەر بۆنی عەتر و گوڵاویشی لێ بێ، دەبێ لە ڕاستی و دروستیی چڵك کردنەکەی بە شك بین. ئەوەش یانی دڕدۆنگی لە چەپەڵی و پیسیی ئێستای جیهان و کام یەك لە "ئیدیولۆگە" بەرێزەکان

دەتوانن لەو باودۆخەدا دڕدۆنگ نەبن و پاشان ئەگەر پیسایی‌یەك لە ئارادا نەبوو بە گیان و دڵ سەر بۆ ئەو بارودۆخە دانەوێنن. سەردەمی ئەوە هاتووە کە نووسەر بە خۆیدا بێتەوە و نوسراوە بە نووسەردا. مەگین زەینی نووسەر دەستکاری کۆمەڵ نییە؟ ئەگەر بە خۆیدا بێتەوە بە کۆمەڵیشدا هاتۆتەوە. لەو بارودۆخەدا دەبینین کە تاکەکەس خۆی دیالیکتێکی دیاری ناخە. لێ گەڕێن با ئەو ناخی خۆی هەڵچۆڕێنێ. چونکە ئەو کۆمەڵگاش دەردەدا لە گەڵیا. ئەدا و ڕەوشت و یاسا و ڕێسا و ئەخلاقی خۆتان لە سەر ڕێگاکەی لابەن. لێ گەڕێن با چاو لە خۆی ببڕێ لەو کاتەدا کە چاوی لە ئێوەش بڕیوە. لێ گەڕێن با خۆی ببینێ، چونکە لەو کاتەدا مێژووش دەبینێ.

سەرچاوە: کتاب جنون نوشتن، دکتر رضا براهنی، چاپ اول، ١٣٥١ تهران.

## فەرهەنگۆك

**ئەدگار**: روخسار، دەموچاو، سیما

**بەستۆکە**: سەڵیتە، ژنی داوێن پیس

**بەرخۆدان**: دیفاع، پارێزگاری

**پانتایی**: بەرینایی

**پەسلان**: حەشر

**تەشق**: بەرزایی ئاسمان، پەرپەرۆچکە

**خرتك**: جومگە، بەندی یەسقان، گە

**خمخۆرك**: باتلاخ

**داوەشان**: هەلاهەلا بوون

**دژواز**: دژخواز

**رمووده**: هۆگر، ئالوودە

**ژیار**: تەمەدون

**ساندان**: رانان و ڕیز کردنی لەشکر، سان

**سایلۆح**: گەوج، گەمژە، حەپۆل

**سفلیس**: ئاکلە، نەخۆشییەکی ئەندامی جنسیی ژن و پیاوە.

**سوورەکوان**: دمەڵ، زیپکەی گەورە و بەژان

**گرێبەست**: قەرارداد



**قەشمەرجاڕ**: گاڵتەجاڕ

**مجرۆ**: نوقستان، فەلەج

**مەرایی کردن**: ریایی کردن، خۆشامایی کردن

**مەڵحەکە**: پێکەنینی، قەشمەری

**هێلوون**: قووڵکی چاو، چاڵی چاو

# ناوەکان

**ئۆژن یونێسکۆ:** (١٩١٢-    ) شانۆنامە نووسی فەرانسەوی بە ڕەچەڵەك ڕۆمانیایی، بەرهەمەکانی بە شێوازی شانۆنامەی پووچین.

**جیمز جۆیس:** (١٨٨٢-١٩٤١) نووسەری ئیرلەندی. بەرهەمەکانی: دوبلینییەکان، شانۆنامەی شاربەدەرەکان، ئولیس.

**چوومبەی مەلعوون:** مووسا چوومبە، یەکێك بوو لە نۆکەرەکانی سازمانی سیا لە کۆنگۆ کە حکوومەتی (شۆڕشی پاریس)ی لۆمۆمبای لەنێو برد.

**ساموئێل بێکێت:** (١٩٠٦-١٩٨٩) شاعیر و شانۆنامەنووسی ئیرلەندی، بناغەدانەری شانۆنامەی پووچی. بەرهەمەکانی: کۆی شانۆنامەکانی بێکێت، لە چاوەڕوانی گۆدۆدا، ڕۆژە خۆشەکان.

**لیندۆن جانسۆن:** (١٩٠٨-١٩٧٣) سی و شەشەمین سەرۆككۆماری ئەمریکا (١٩٦٣ هەتا ١٩٦٩).

**ویلیام فاکنێر:** (١٨٩٧-١٩٦٢) چیرۆكنووسی ئەمریکایی، ساڵی ١٩٤٩ خەڵاتی نۆبێلی لە ئەدەبیاتدا وەرگرت. زۆربەی بەرهەمەکانی کراونەتە فیلم. بەرهەمەکانی: توڕەیی و قاڵمەقاڵم، نامۆیەك لە تۆزدا، هاوینی گەرم و درێژ و....

**هارۆڵد پینتێر:** (١٩٣٠-  ) شانۆنامەنووسی بریتانیایی، بەرهەمەکانی بە شێوازی شانۆنامەی پووچین.



# بەرهەمە چاپکراوەکانی وەرگێڕی ئەم کتێبە

١- تاپۆی وەرزێکی سەوز، ١٩٩٧، تەورێز (کۆمەڵە شیعر)

٢- شەوەژانی ئەستێرەیەك، ٢٠٠١، تاران (کۆمەڵە شیعر)

٣- مەرگەخەون، ٢٠٠٤، تاران (کۆمەڵە شیعر)

٤- دیسان لەو شەقامانەوە، ٢٠٠٦، هەولێر (کۆچیرۆك، بیژەنی نەجدی/ وەرگێڕان)

٥- تەپڵی ئاور، ٢٠٠٦، هەولێر (کۆچیرۆك، چەند نووسەر/ وەرگێڕان)

٦- جێگای بەتاڵی سلووچ (ڕۆمانی فارسی/ مەحموود دەوڵەت ئابادی/ وەرگێڕان)

٧- برایانی کارامازۆف (شاکاری داستاییڤسکی) وەرگێڕان، ٢٠٠٧.